# بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

**H4kurd _ SfD**

لەمرۆدا باسی زمانی **CSS** دەکەین

پێشەکی

**css** بەزمانی شێوازی پەڕە ناسراوە کە یەکێکە لەو زمانانەی زیاتر بۆ جوانکاری و ڕەونەقدان بە پەڕگەکانی ماڵپەڕ تێدەئاخنرێت تا لەڕێگەیەوە هەرچی کردار و فەرمانەکانی نێو پەڕەکانی شێوازی جوان وەربگرێت، ئەم زمانە لەلایەن **Håkon Wium Lie**ەوە لەساڵی **1994** دروستکرا کە ئەوکات لە کۆمپانیای **Opera** کاری دەکرد، پاشان بۆ کاری ئیمەیڵ لەنێو کۆمپانیای **W3C** ڕاژەکاری بۆ کراو وەشانی **CSS1**ی پێوە لکێنرا کە بەناوی (**CSS1**) **W3C CSS Recommendation**)ەوە لەساڵی **1996**دا بەتەواوەتی جێگیر بوو.



وێنەی هاکێن دروستکەری زمانی **css**

ڕوونکردنەوە

ئێمە کەدەچینە سەر پێگەیەك ڕووی وێنەیی دەبینین، ئەو ڕووە وێنەییە داڕێژراوی چەندین زمانی جودایە، لەسەر ماڵپەڕ، بۆ نموونە کاتێك گووگڵ دەکەینەوە ئێمە تەنها بەم شێوەیە دەبینین:

+Your Gmail Images

Google

Google Search I'm Feeling Lucky

کە لەڕاستیدا ئەو وێنەیە بەچەندین زمانی جودای بواری وێب دیزاین داڕێژراوە لەوانە (**HTML + CSS + JS + JQ + PHP..etc**) وەچەندانی تر کە کاری جودا دەکەن لەسەر پێگەکە، هەرکات ئێمە بمانەوێت سۆرس کۆد (سەرچاوەی کۆد)ەکانی ئەو پێگەیە ببینین، ناتوانین هەموو ئەو کۆد و زمانانەی لە دروستکردنی پەڕەکەدا کراوە بەدیار بخەین چونکە بەوکارە ئێمە تەواوی زانیاریەکان دەبینین،

ئەوەش کارێکی یاساغ و ڕێگەپێنەدراوە، بەڵام هاوکات دەتوانین کۆد و سکریپت و زمانە سەرەکی و سەرەتاییەکان ببینین بەئاسانی وەك (HTML + CSS + JS + JQ..etc) F12 ئەو کارە دەکات بەجوانی و کرتەی ڕاست پاشان بچۆ سەر **View Page Source** هەمان کار دەکات.

وێنەکەی سەرەوە **CSS** تێیدا کارایە، بەڵام ئەگەر ئەو جوانکاری و ڕەونەقە لابەرین واتە زمانی **CSS** لابەرین بەم شێوەیە گووگڵ بەدیار دەکەوێت:




ئەوە تەنها ئێمە **CSS**مان لابردووە، دەبینی کە چەندە ناشرین دەردەکەوێت. بۆیە **CSS** زۆر گرنگە بۆ گەشەپێدەر و دارێژەر و دیزاینەری بواری وێب، وە بۆ ئێمەش گرنگە چونکە کاری هاکینگ پێویستی پێیەتی لەزۆر ڕووەوە، وەك (پەڕەی ساختە، ئیندێکس، وێب سایتی درۆینە..هتد) کەدەبێت لایەنی دیزاین و جوانکاری تێیدا فەرامۆش نەکەین بە **CSS** جوانترین سایت درووست بکەین هەتا کەسی سەردانکەر تێ بکەوێت بەوەی ئەم پێگەیە کەسانی شارەزا درووستی کردووە و ڕێی تێ ناچێت ئامرازی هاککردنی تێدابێت.

پێناسە

**CSS: Cascading Style Sheets**، زمانی پێکراوی جوانکاریە بۆ جوانکردنی ماڵپەڕەکانی سەر بە ئینتەرنێت درووست کراوە، بەپێی یاسا و ڕێسای خۆی کاردەکات و هەڵە تێ دەپەڕێنێت، وە زمانێکی بازاڕی بەکار دەهێنێت بۆ یاساکانی، بۆ نموونە: **background, border, size..etc**.

یاسا

هەموو زمانێك لەجیهاندا یاسای تایبەت بەخۆی هەیە، کە ڕستەسازی بۆ ئەویاسایە دارێژراوە لەلایەن درووستکەرەکانیەوە بە ئینگلیزی پێی دەگوترێت (**Syntax**)، لەم نێوندەکا یاسا (**Rule**)ی **CSS** بەم شێوەیە دادەڕێژرێت:




لێرە زیاتر فێربە: **http://www.w3schools.com/css/css_syntax.asp**
ئەو وێنەیە لەسایتی **w3schools** هێنامان، چونکە ئەو پێگەیە فێرکاریەو تایبەتە بە خاوەن کۆمپانیای وەگەڕخەری زمانەکەش، واتە **css** موڵکی **W3C**ەو لەوێش فێرکاری تێدایە.
ئەوجا دێین بنەمای یاساکان شی دەکەینەوە:
**Selector**: دەستنیشانکەر، واتە ئیلیمێنتێك کە یاساکەی بەسەردا جێ بەجێ دەبێت، واتە کرداری جونکاری بۆ بکەین، لێرەدا **h1** ئیلیمێنتێکی **html**ە دەستنیشانکراوە بۆ ئەوەی ڕستەسازیەکی **css**ی بەسەردا جێ بەجێ بکات، لەخوارەوە باشتر لە **selector** تێ دەگەین.

**Selector**

کاتێك دەمانەوێت ڕستەیەکی **css** بنووسین دەبێت پێش ئەوە کردارێك یاخود فەرمانێکی جێبەجێکاری دەستنیشان بکەین بۆ ئەوەی ئەو ڕستەیەی کە **css**ەکەی پێ دەناسێنین بناسێت و لەسەر ئەو دەستنیشانکراوە کردارەکان جێ بەجێ بکاتن، وە سەلێکتەرەکانیش دەکرێت بەچەند بەشێکەوە:
+ **Element Selector**: مەبەست لێی ئیلیمێنتێکی زمانی **html**ە کە ڕستەسازی **css**ی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێتن، بۆ نموونە:
**HTML: <span>h4kurd</span>**
**CSS: span {color:red;}**
بەهۆی **css** ڕەنگی نووسینی ناو ئیلیمێنتەکە دەکات بە سوور – دەستنیشانکراوەکەش **span**ی **html**ە.
+ **id Selector**: لێرەدا **ID** مەبەست لێی دەستنیشانکراوەی سەرەکی پێدەری سەرتۆپە، کە دەتوانین بەهۆی **id**یەوە ناوەڕۆك بەبەشە لاوەکیان بناسێنین.
**Id** لە کاتی ڕستەسازیدا بە هاش **#** دەناسرێتەوە، بۆ نموونە:
**#main {text-align: center; color: black;}**
+ **Class Selector**: پۆلەکانی نێوەند کاتێك لەنێو ئیلیمێنتەکانی **html**دا پۆلێك هەبوون کە پەرتەوازە و لاڕێ بوون، دەتوانین بە کلاس ئەوان کۆ بکەینەوە، بۆ نموونە کلاسێك پێك دەهێنین بۆ چەند دانە تاگێکی پەرەگراف، یاخود تاکە پەرەگرافێك:
**Class** بە نوکتە **•** لەڕستەسازیدا دەناسرێتەوە، بۆ نموونە:
**.name {background-color: lightblue;}**
+ **Grouping Selectors**: دەستنیشانکراوەکان لە **css**دا ڕێگەپێدراوە کە بۆ چەند دانە فەرمانێك بەشێوەی گرووپ ڕستەسازی و یاساکان ئەنجامبدرێتن، بۆ نموونە دەمانەوێت تاگەکانی (**p + h2**) هەمان جوانکاریان بۆ بکەین، کە بۆ ئەو مەبەستە بە فاریزە ، جودایان دەکەینەوە:
**p, h2 {font-family: verdana; text-align: center;}**
+ **Universal Selector**: هەروەها ئەم دەستنیشانکەرە بەشێوەیەکی گشتی تێکرای ئیلیمێنتەکان دەگرێتەوە، بە * دەناسرێتەوە:
هەموو پەرەکە ڕەنگی نووسینەکەی ڕەش بێت:
***{color: black;}**
ئەوانەی لەسەرەوە باسکران بەشێوەکی گشتی بوو، لێرەش دەتوانی دەستنیشانکەری دیکە بناسیت: **http://www.sitepoint.com/web-foundations/css-selectors**

## تایبەتمەندی Property

تایبەتمەندی، مەبەست لە تایبەتمەندی پێدەرە، کە لەنێو **css**دا ناسراین، زۆر جۆرو شێوە تایبەتمەندی هەن، لەوانە ( **color, font, size, border, background, margin, padding..etc**) کەلەدواییدا یەکە یەکە باسی زۆربەیان دەکەین.

## نرخ Value

نرخ، مەبەست لێی نرخ دان – بەهادانە بەو تایبەتمەندیەی تۆ لەپێشتر ناسێنراوە، نرخەکانیش یان بە نووسین **String** دەبێت یاخود بە ژمارە بەیانیەکان.

**border: none;**

**{Property: Value;}**

**border: 1px;**

**{Property; Value;}**

## ڕەنگەکان Colors

لە **css**دا رەنگەکان بەچەند شیوەیەك دەناسرێنەوە، لەوانە:

+ **Hexadecimal colors**: بەشێوەی **HEX** ڕەنگ دەناسێتەوە لەسەر وێبگەڕەکە و بێگومان ئەویش دەچێتە ناو کاش و لەوێشەوە بۆ **CPU** و لەوێشەوە بۆ گرافیك کارتەکان و لەوێشەوە بۆ مۆنیتەر، بۆ نموونە:

**Green** سەوز

**p {color: #060}**

**p {color: #00FF00}**

+ **RGB Colors**: **r: red , g: green , b: blue**، ئەم پێکهاتەیە بۆ ڕەنگەکان کەدەتوانین زۆرینەی ڕەنگەکانی دیکەی لێ دروست بکەینەوە، بەسێ خانەی یاسایی دادەڕێژرێت:

**p {color: rgb(0, 255, 0);}**

وەکۆمەڵێ جۆر رەنگی دیکەش هەیە، لەوانە (**HSL**)ەکان، وە لەتەك ڕەنگەکانیش تایبەتمەندی **opacity**هەیە کە دەتوانین ڕەنگەکانی پێ کاڵ و تۆخ بکەینەوە:

**p {opacity: 0.5;}**

هەروەها بۆ ڕاددەی ڕوونی و تۆخی ڕەنگەکان جۆری (**HSLA**)ش دەتوانین بەکار بخەینەوە. لێرە زیاتر فێربە: **http://www.w3schools.com/cssref/css_colors_legal.asp**

خودا یاربێت، لەداهاتوودا لەسەر ڕەنگەکان بابەتێك بەتێرو تەسەلی دەنووسین.

## لێدوانەکان Comments

لێدوانەکان بۆ هەموو زمانێك پێویستە هەبێت، چونکە بۆ مەبەستی (بیرخستنەوە، فێرکاری..هتد) زۆر گرنگە، چونکە لێدوانەکان تەنها کاریان ئەوەیە شتێك بڵێن و شتێك دەربخەن کە تەنها لەنێوەندی داڕشتەکاری زمانەکە بەدیار دەکەوێت، واتە لەدەرەوەی زمانەکە کار ناکات و تەنها بۆ مەبەستی دەرخستنی شتێکە. لە **css**دا لێدوانەکان بەدوو جۆر دەنووسرێت:

+ تەنها هێڵێك: بۆ تەنها هێڵێك دەتوانین ئەم هێمایە بەکار بهێنین

**/* Comment */**

لەدەرەوەی یاساکەش دەتوانین بۆ تەنها هێڵێك ئەم فەرمانە جێ بەجێ بکەین:

**// Comment**

+ چەند دێڕێك: بۆ چەند دێڕێك بەهەمان شێوە دەتوانین:

/*

**Comments a**

**Comments b**

**Comments c**

*/

که وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا لێدوانەکان تەنها لەناو زمانەکە دەبینرێن و لەدەرەوەی زمانەکە هەرچی نووسراوە بەدیار ناکەوێت لەسەر ماڵپەڕ.

### جۆرەکان **Types**

**css** چەند جۆرێکی هەیە، مەبەست لەجۆرێتی ئەوە نیە لەناو خودی زمانەکە پۆلێنبەندی بکەین بۆ جۆرێتی لەیاساکانیدا، بەڵکو مەبەستمان بەستنەوە و گرێدانی **css**ە بە فایلی سەرەکی، جا ئەوانیش چەند جۆرێکن:

**+ Inline**: مەبەست لەناو هێڵی تاگەکانی **HTML**ە کە تێیدا لەتەك ئیلیمێنتێکی **HTML**دا یاساکان دەنووسرێتەوە کە **style** دەیناسێنێت، بۆ نموونە:

```
<div style="text_align: center;">
HELLO CSS
</div>
```

**+ Internal**: ناوەکی، مەبەست لەوەیە لەناو خودی زمانی **html**دا زمانی **css**یش لەسەری دەناسێنێت، لەناو تاگی **<head>**دا ئەم جۆرە دەنووسرێتەوە، وە بەم شێوەیە دادەڕێژرێت:

```
<head>
<style typ="text/css">
#content{
        Font_family: arial;
        Color: blue;
}
</style>
</head>
```

**+ External**: دەرەکی، فایلێك بەپاشگری **css**. درووست دەکەین و هەرچی یاسایەك هەبوو تێیدا دەنووسین، بۆ نموونە **name.css** ، سوودی ئەم جۆرە ئەوەیە کە بۆ فایلێکی **css** دەتوانین لەچەندین پەڕگەی **html**دا بانگی بکەینەوە بەڕستەیەك کەلەناو فایلی **html** لە تاگی **<head>** دەنووسرێت:

```
<head>
<link rel="stylesheet" type="text/css" href="name.css" />
</head>
```



## نەوەکانی **CSS**

تاکو هەنوکە **CSS** سێ نەوەی لێ دەرچووە، کەهەریەکەیان تایبەتمەندی گرنگی پێدراوە.

**+ CSS1**: پشکی وەگەرخستنی **CSS1** لەلایەن کۆمپانیای بەرهەم هێنان و گواستنەوەی شەبەکە جیهانیەکان (**W3**) بوو کە بۆ یەکەمجار توانی ئەو زمانە کەمەندەکێش بکات بۆ خۆی کەتایبەتمەندی پێدەرەکەی لەم بوارانەدا خۆی دەبینیەوە:

- نووسین (**font**) بۆ ووێنە (جۆری نووسین)
- رەنگ (**Color**) بۆ ووێنە (شێوەدان بەرەنگی پشتەوەی نووسینەکان **_Background_color_**)
- دەق (**Text**). لێرەدا دەق تونای گواستنەوەی دەبێت لەنێوەندی پەرگەکەدا لەوانە (ناوەراست و سەرەوە و خوارە و راست و چەپ)
- **border, padding** , چوار چێوە و شوێنی تاگەکان دیاری دەکەن.
- تایبەتمەندیەکی تری **CSS1** بەگروپکردنی تاگەکانە. واتە بەکاربەر دەتوانێت هەرچی تاگەکانی ناو **HTML**هەیە بیکات بە یەك گروپ و یەك تایبەتمەندی پێ بدات. بۆ ووێنە: **h1,h2,h3,h4**.

**+** نەوەی (**CSS2**) : ئاستی دووەمی زمانەکە لەساڵی **1998** لەمانگی **5**دا لەلایەن کۆمپانیای (**W3**)ەوە. زیادکراوەکانی بریتین لە (**absolute, relative, and fixed positioning of elements and z_index**) و چەندانی تر.

**+** وەشانی (**CSS3**) لەساڵی (**1999**)دا لەلایەن هەمان کۆمپانیای پێشتر خرایە روو (**W3**) لەمانگی **7**دا. لەسەرەتاوە گۆرانکاریەکان بەباشی نەبرابوون بەرێوە هەتا لەساڵی **2011**دا دووبار دارشتنەوە بۆ ئەم نەوەیە کرا بە زیادکردنی **40** تایبەتمەندی گەورە و گرنگ. لەوانە: (**Opacity, transparent**, ئالوگۆری رەنگەکان, ناسینەوەی براوزەرەکان و تایبەتمەندی بەهەریەکەیان)

## Browser Support

زۆرێك تایبەتمەندی **css** هەن کە لەبراوزەکاندا واتە وێبگەرەکان ناکۆکیان هەیە، واتە لە وێبگەرێکدا کاردەکات و لە یەکی دی کار ناکات، یاخود لەهەموو وێبگەرێکدا کار دەکات، وەك نەوەکانی **css1** و **css2**، بەڵام ئەم گرفتە تا سەر نیەو بەهۆی وەشانی نوێی وێبگەرەوە تایبەتمەندیە نوێکەش چالاك دەکرێتن، پێشکەشکردنی هەندێك لەتایبەتمەندیەکان بۆخۆی گرنگی هەیە لەلایەن وێبگەرەکانەوە دەبێت بەو جۆرەی کە خۆی دەیەوێت بناسرێتەوە، بۆ ووێنە:

**_ms {IE 9}**

**_webkit {Chrome, Safari, Opera}**

**_moz {firefox}**

**..etc**

## پێویستیەکانی **css**

بۆ ئەوەی بتوانین هەموو کۆدەکانی **CSS** بنووسرێن وە بەکاربەر لەرێیەوە بتوانێت زانیاریەکان ببینێت و دەسکاری و گۆرانی تێدا بکات دەبێت ئەم پێداویستیە سەرەتایی و بنچینەیانەی هەبێت:

**1**.نەرمەواڵایەك بۆ نووسینی کۆدەکان وەکو لە ویندۆزدا **notepad.exe** وە بەرنامەی تر زۆرن کەپێیان دەوترێت (**TextEditors**)ەکان وەکو (**Notepad++, Bluefish, VIM, Textpad, WordPad..etc**) کەهەمان کاری نەرمەواڵاکان دەکەن ئەوانەی لەناو ویندۆزەکان بەشێوەی خودکاری وەگەرخراون.

**2**. ئیدایتەرێك بۆ رێگە خۆشکردنی نووسینی هەرچی کۆدێکی **css** وەك **Adobe Dreamweaver**

**3**. وێبگەر یاخود ئیشپێکەرێکی کۆدەکانی **HTML** و **CSS** وەك:

**Internet Explorer** لەویندۆزدا و **Safire** لە ماکەکاندا.

## **css** لەکوێ دەنووسرێت؟

هەرچەندە پێشتریش ئاماژەم پێدا بەڵام لێرە بەخێرایی پێت دەڵێم، ئێمە بۆ هەموو نموونەکان **css** بەجۆری **internal** دەنووسین، واتە لەنێو تاگی **<head>** و راستەوخۆ پەیوەند بە زمانی **html** بەهاوبەشی ئەو زمانە، بۆ ئەوەی هەموو کۆدەکان بەجوانی و بەتەواوەتی ببینین و لێی تێ بگەین، ئەمەش میتۆدی ئەو جۆرەیە:

```
<html>
<head>
        <style type="text/css">
                +CSS Rules
        </style>
</head>
<body>
        HTML Tags
</body>
</html>
```

هەرچی لەسەرەوە باسکرا کەمێك بوو لەناساندنی بنەماکانی زمانەکە، لێرە بەدوا پێم باشە هەنگاو بنێین بۆ جێبەجێکاری **Practical** چونکە بەو کارە باشتر تێ دەگەین و زیاتر فێردەبین.

تایبەتمەندیەکان بەشێوەی ئەلفابێتیکاڵ (**A - Z**)

**Background**

تایبەتمەندیەکی تەنها نیە و لەدەوریدا دەبێت پێوەلکاوێکی هەبێت وەك (**attachment, color, image..etc**)، لەکاتێکدا دەتوانین بەهۆی وەشانە نوێیەکانەوە ڕێگە بدەین بەتەنها کاری ئەوانە هەموو بکاتن، واتە دەتوانین نرخ **Value**ی جوداوازی پێ بدەین ئەگەر تەنهاش بێت، بۆ نموونە:

```
<html>
<head>
<style type="text/css">
body {
background: #444 url(azhal.jpg) no-repeat center;
}
</style>
</head>
<body>
<p align="center">H4kurd {background} Property Example</p>
</body>
</html>
```

تێبینی/ لەبەر ئەوەی یەکەم نموونەیە هەموو کۆدەکان دەنووسینەوە، بەڵام لەمەبەدوا چیتر کۆدی **html** نانوسین و تۆ دەبێت تێ بگەیت لەوەی **css** لەکوێرا دەنووسرێت، وە دەمانەوێت لەسەر ئەم نموونەیە با بدوێین، بۆ ئەوەی ئەوانی دیکەش زۆر بەباشی لێك بدەینەوە، بۆیە بەباشی لەم نموونەیە بڕوانە.

ئەنجامی نموونەکە




لە نموونەکەدا تایبەتمەندی **background** بەتەنها خۆیەتی و لەپاش ئەو نرخەکانی دێت، کە زۆرێك لەنرخەکانمان تێ کردووە وەك (**color , image, repeat, position**) ، کە بۆ کەسێك سەرەتای بێت لەزمانەکە دڵنیام ئەو هەموو تایبەتمەندیە قورس دەکەوێت لەسەری، بەڵام ناچارین کەبەو شێوەیە نموونەکە دابڕێژین.

ئەوجا دێین نموونەکە شی دەکەینەوە:

```
body {
background: #444 url(azhal.jpg) no_repeat center;
}
```

**body**: تاگێکی **html**ە و بە بۆدی (جەستە، پەیکەر) ناسراوە، کە لەناویدا زۆرینەی فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکرێت، ئێمە بۆ ئەوەی **body**بکەین بە سەلێکتەر یاخود دەستنیشانکراوێکی **css** لەسەرەتای یاساکەوە نووسیومانەتەوە، واتە ئەو یاسایە، یاخود تایبەتمەندیەکان هەموو بەسەر تاگی **body**دا جێ بەجێ دەبێت، بەمەرجێ ئەوانەی لەنێو ئەو براکێتانەدا بن **{}** ئەو براکێتانەش دەتوانی بەهەر جۆرێك بێت بنووسیت:

```
{
css
}
{css}
{ c s s }
css{}
css {   css}
css{css    }
..etc
```

پاشان **background** دێت کە تایبەتمەندیەکی **css**ە و لەسەری دەتوانین زۆرێك نرخی جوان و ڕەونەقدار دابنێین، پێشتر لەسەری دواین.

پاشان (نرخ، نرخەکان) دێت. ئەوەی گرنگە (url(azhal.jpg کە **url** مەبەست لەدیاریکردنی ئەو ڕێڕەوەیە کە وێنەکەی تێدایە، ئێمە ڕاستەوخۆ لەتەك پەڕەکەوە وێنەکەمان هەیە لەگەڵ پاشگرەکەی.
لەدوایدا سیمیکۆڵۆن دێن **;** ئەمە بۆ ئەوەیە ڕای بگەیەنین بە **css** و پێی بڵێین ئەم ڕستەیە هەتاکو ئێرە تەواوە و لەدوای ئەوە بۆ ئەو تایبەتمەندیە هیچ شتێکی دیکە نایەت، واتە ڕاگەیاندنی خاڵی کۆتایی ڕستەسازیەك **Syntax**یـــك، لێرەدا بۆ تایبەتمەندی **background** کۆتا نرخ **center** بوو دوای ئەو هیچی دیکە نەهات و ئێمە ڕامان گەیاند کە تەواو بوو **;** ، پاشان دەتوانین تایبەتەمەندیەکی دیکەشی بۆ زیادە بکەین.
لە **css**دا دەتوانین چەند تایبەتمەندیەك بدەین بەسەر دەستنیشانکراوێك بۆ نموونە ئێمە چەند تایبەتمەندیەك دەنووسین بۆ پەرەگرافێك:

```
<style type="text/css">
p{
background-color: #fff;
text-align: center;
font-family: "verdana", arial;
}
</style>
```

لەو نموونەیەدا ســێ تایبەتمەندیمان دانا بۆ پەرەگرافێك.

### background-attachment

تایبەتمەندیەکی دیکەی **css**ە بۆ بەستنەوە و گرێدانی باکگراوند دەبێت، بۆ نموونە باکگراوندەکە چۆن لەگەڵ کارسەر (ماوس)ەکەدا یەك بگرێت؟ یاخود چۆن باکگراوندەکە دەچەقێنێت و جوڵەی لێ دەبڕێت؟..هتد

**Syntax: background-attachment: { scroll | fixed | inherit }**

بەشێوەیەکی خودکارانە باکگراون ئەتاچمێنت **fixed**ە، واتە نەگۆڕە، کاتێك نووسینێکی زۆرمان دەبێت لەناو پەڕەی ماڵپەڕەکەدا و باکگراوندێك بە **css** دادەنێین بۆ پشتەوەی ئەوکات ئەگەر بە ماوسەکە بێینەخوارەوەی پەڕەکە باکگراوندەکە تێ دەپەڕێنێت، واتە دیار نامێنێت.
بەڵام ئەگەر باکگراوند ئەتاچمێنت بکەین بە **scroll** ئەوکات لەگەڵ سکرۆڵی ماوسەکە یاخود سکرۆڵ بارەکەدا دێت و دەچێت:

**background-attachment: scroll;**

تێبینی/ چەند نرخێك **value**ی دیکەش هەن بۆ باکگراوند ئەتاچمێنت وە بۆ هەموو ئەو نموونانەی لەپاشدا باسیان دەکەین، بەڵام ئێمە هەموو نرخەکان نانووسین، تەنها ئەوانە دەنووسین کە زۆر کارمان پێی دەبێت و لە ماڵپەڕەکانیشدا زۆر کاری پێ دەکەن، چونکە ئەگەر هەموو ئەو نرخ و تایبەتمەندیانە بنووسینەوە، ئەوا پێویستمان بەکاتێکی زۆر دەبێت، ئەمە مانای ئەوە نیە کەلێی نازانین یان هەر شتێك لەو بابەتە، بەڵکو نامانەوێت بابەتەکە زۆر قورس بکەین و ئێمە لێرەدا تەنها دەرگاکە دەکەینەوە و خۆت دەتوانی پاش ئەوەی دەرگای فێربوونت کردەوە لەهەمبەر **css**دا بگەڕێیت بەدوای بابەتی زێدەتر لەسەری و خۆت فێربکەیت، باوەڕکە ئەگەر خوێتم بووە بەئاو من **7**ساڵە لەگەڵ **css**و بواری وێب دەژیم.

### background-color

ووتمان ڕەنگەکان چەند داڕێژراوێکیان هەیە، لێرەدا ڕەنگی باکگراوند مەبەست تەنها ئەوەنیە تۆ پشتەوەی پەڕەکەت ڕەنگ بکەیت، مەبەست لە باکگراوند بەگشتی باکگراوندی بەشێك – شتێکە، جا ئیتر گشت بێت یان تاکە ئیلیمێنێك گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە تۆ سەلەیکتەرێك تایبەتمەند بکەیت، بۆ وێنە باکگراوندی وشەیەك، دێڕێك، هەموو پەڕەکە..هتد.
نموونە:

```
p{background-color: #129911;}
body{background-color: orange;}
```

ئەنجامی نموونەکە

H4kurd {background} Property Example

**background_image**

بۆ دانانی وێنە بۆ پشتەوەی بەشێك یاخود (پەرگەکە – پەرگەکان)ی ماڵپەڕ دەبێت، بە **url** شوێنی وێنەکە و پاشگرەکەی دەستنیشان دەکەیت.

نموونە:

```
<html>
<head>
<style type="text/css">
#main{
background_image: url('bg.jpg');
padding: 50px;
}
</style>
</head>
<body>
<div id="main">
<p align="center">
H4kurd {background} Property Example
</p>
</div>
</body>
</html>
```

نموونەکەم هەمووی نووسی بۆ ئەوەی ئاسانتربێت. وە تایبەتمەندی **padding** لەئێستادا لەیاد بکەن.

ئەنجامی نموونەکە

H4kurd {background} Property Example

## background_position

پۆزیشن یاخود شوێن، مەبەست لێی شوێنی دەرکەوتنی باکگراوندەکەیە، بۆ وێنە (لاکان، سەرو خوار، ناوەڕاست..هتد).
لەم نموونەیەدا وێنەیەك دەخەینە بەشی سەرەوە لای دەستە چەپی پەڕەکەمان:

**background_image: url('azhal jpg');**

**background_position: top left;**

ئەنجامی نموونەکە



بێگومان دەبینی چەندین وێنەی چونیەك دێتە سەر پەڕەکە، هۆکاری ئەوەش ئەوەیە کە ڕیپێت یاخود دووبارە دەبنەوە وێنەکان، چونکە قەبارەکەیان لەقەبارەی شاشەی وێبگەڕەکە کەمترە، بەلاَم وێنەی سەرەکی دەچێتە بەشی سەرەوە لای دەستەچەپ بەجوانی خۆی بەدیار دەخات، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی دووبارەبوونەوە، سەیری **background_repeat** بکە.
وە تۆ دەتوانی نرخ **Value**ی دیکەی پێ بدەیت بەئارەزووی خۆت بۆ ووێنە:

**left bottom**

**right top**

**right center**

**right bottom**

**center top**

**..etc**

## background_repeat

بۆ نموونە وێنەیەك چۆن و بەچ شێوەیەك ببێت بە باکگراوند بۆ پەڕەیەکی ماڵپەڕەکەمان؟، ئایا یەك وێنەبێت لەناوەڕاستدا؟ یەك وێنە بێت بێ دووبارە بوونەوە؟ یەك وێنەی دووبارە بوو بێت بەلاَم بەدایرێکتەری **x** و **y** یان ..هتد، دووبارەبوونەوەی (وێنە – وێنەکان) گرنگە لەمەڕ گونجاندنی ئەو وێنەیەی بۆ (بەشێك – هەموو) پەڕگەکەی دادەنێین، با نموونەکەی سەرەوە تەواو بکەین:

**background_image: url('azhal jpg');**

**background_position: top left;**

**background_repeat: no_repeat;**

ئەم نرخە (**no_repeat**) واتە دووبارە نابێتەوە.

ئەنجامی نموونەکە:



ئەمەش چەند نرخێکی دیکەیە بۆ دووبارەبوونەوە:

ئاسۆیی:
**repeat_x**

ستوونی:
**repeat_y**

**background_size**

قەبارەی باکگراوندەکەیە، بێگومان قەبارەش بەشێکی گرنگە لە **css** کە بەچەندین یەکەی جودا دەپێورێت، لەوانە ( **point, pixel..etc**)، بۆ نموونە:

**background_size: 400px 200px;**

ئەنجامی نموونەکە:



## Border

تایبەتمەندیەکی دیکەی **css** بریتیە لە بۆردەر کە بەچەندشێتوەیەك دەناسرێتەوە، بۆردەر واتە (سنوور، لێوار، قەراخ)، جا ئەوانە بۆ هەر شتێکی (پەڕگە-پەڕگەکان) بێت یاخود بەشێك ئیلیمێنتێکی پەڕگەکە بێت، دەبێت و کاری خۆی دەکاتن.
بۆردەر چەند لقبەندێکی دیکەی لێ دەبێتەوە، گرنگترینیان ئەوانەی لای خوارەوەن.

### border_style

شێوازی دەرکەوتنی قەراخەکان چۆن و بەچ شێوەیەك بن؟
نرخەکان (**solid _ dashed _ dotted _ none**) وە هەتا دوایی. ئەو شێوانە بریتن لە (شێوەی سادە، خەت، خاڵ، هیچ):




نموونە:

```
border_style: solid;
border_style: dotted;
```

ئەنجامی نموونەکە:




دەبینی دوو جۆرە شێوازمان بەکارهێناوە، شێوازی گشتی بۆ تەواوی پەرەگرافەکە (**solid**)ە و ئەوەی ناو براکێتەکەش **border** ئەویش شێوازی (**dotted**)ە، کە بەم شێوەیە دادەڕێژرێت لەناو **css**:

```
p{
border_style: solid;
}
.b{
border_style: dotted;
}
```

دۆت **b** (**.b**) بەمانای **Class**ی پیتی **b** دێت کە ئێمە بەو پیتە ناساندومانە وەك پۆلێکی جودا لە پەرەگرافەکە **p** ، بەم شێوەیە لەناو **html**دا:

```
<p align="center">
H4kurd <span class="b">{border}</span> Property Example
</p>
```

لاکان

بۆ لاکان دەتوانین بۆردەر بگونجێنین بۆ هەموو لایەك یاخود تەنها لایەك، یاخود چەند لایەك بەیەکەوە، بۆ نموونە بۆردەر بۆ پەرەگرافێك دەگونجێنین بۆ تەنها بەشی سەرەوە، ئەویش بەتەنها ڕەنگ کردنی ئەو بەشە:

```
border_top_color: blue;
```

بەشەکانی دیکە:

border_left
border_right
border_bottom

بۆ جیبەجیکردنی نرخێك لەسەر لاکان، دەتوانین هەموو چەشنە سینتاکسێك بەکار بهێنین، بۆ نموونە:
border_top_style: none;

ئەمە واتای ئەوەیە بەشی سەرەوەی بۆردەرەکە هیچ نەبێت، واتە قەراخی نەبێت..هتد.

**border_color**

بێگومان ڕەنگی (قەراخێك – چەند قەراخێك – قەراخەکان) دەگرێتەوە، نموونەکانی خوارەوە سەیر بکەن:

قەراخێك:
border_top_color: blue;

چەند قەراخێك:
border_top_color: blue;
border_bottom_color: green;

قەراخەکان:
border_color: yellow;

نموونەی قەراخەکان:

```
p{
border_style: solid;
border_color: yellow;
}
```

ئەنجامی نموونەکە:

H4kurd {border} Property Example

**border_radius**

مەبەست لەدانانی نیوەتیرەیە، واتە چەمانەوەی قەراخەکان هەتا دەگاتە نیوەتیرەی بازنە، ئەمەش کارێکی جوان و نایابە لە css3دا زیادەکراوە، نرخەکەی بە یەکەکەکان دەپێورێت بۆ نموونە پێکسڵ:
border_radius: 18px;

ئەنجامی نموونەکە:

H4kurd {border} Property Example

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، تۆ دەتوانی بۆ تەنها لایەك ئەو کارە بکەیت یاخود بەئارەزوومەندانە...

**border_width**

قەبارەی پانی قەراخەکان دیاریدەکات، یاخود لایەکی قەراخێك یاخود چەند لایەك، بۆ نموونە هەموو لاکان:
border_width: 10px;
p{

**border_style: solid;**
**border_width: 10px;**
**}**

**P** سەلێکتەرێکە بۆ تاگی **<p>** پەرەگراف، ئێمە بۆ نموونەکان زۆرکات ئەوە باکاردێنینەوە، تۆ دەتوانی هەرچی دیکەت ویست بەکاری بهێنیت بۆی.

ئەنجامی نموونەکە:




## box_shadow

سێبەر دانان بۆ چوارچێوەی شتێك، دەتوانین بەهۆی ئەم تایبەتمەندیەوە سێبەر دابنێین بۆ ئیلیمێنتەکانی **html**، بەم شێوەیە:

**box_shadow: {Horizontal} {Vertical} {Blur} {Color}**

نم:

**p{**
**box_shadow: 12px 8px 6px lightgray;**
**}**

H4kurd {box-shadow} Property
Example

## cursor

شێوازی ماوسەکە چۆن دەربکەوێت کاتێك دەچینە سەر بەشێك؟



**cursor: wait;**

هەندێك جۆرەکانی کارسەر

**auto**
**crosshair**
**default**
**e_resize**
**grab**
**help**
**move**
**n_resize**

**ne-resize**

**nw-resize**

**pointer**

زیاتر: **http://www.w3schools.com/cssref/tryit.asp?filename=trycss_cursor**

**direction**

ئاراستەی دەرکەوتنی نووسینەکان چۆن بێت، لەڕاستەوە بۆ چەپ، یاخود لە چەپەوە بۆ ڕاست؟ ، ئەمە زۆر گرنگە بۆ زمانی کوردی و عەرەبی، چونکە دەتوانی ئاراستەکەی بگۆڕیت بۆ لای ڕاست.

**rtl: Right to Left**

**ltr: Left to Right**

نم:

```
<html>
<head>
<style type="text/css">
.ltr{direction: ltr;}
.rtl{direction: rtl;}
</style>
</head>
<body>
<p class ="ltr">H4kurd {cursor} Property Example</p>
<p class="rtl">هاك بۆ كورد تایبەتمەندی نموونەی ئاراسته</p>
</body>
</html>
```

ئەنجامی نموونەکە:

H4kurd {cursor} Property Example

هاك بۆ كورد تایبەتمەندی نموونەی ئاراسته

**display**

پیشاندان، واتە چۆن (بەشێك – چەند بەشێك) بەدیار بکەون لەناو (پەڕگە – پەڕگەکان)دا؟، لێرەدا چەند تایبەتمەندیەك بۆ ڕستەسازی **display** دیاریدەکرێت بەپێی پیویستی، بۆ نموونە:

لەناو هێڵێکدا:

**Inline**

لەسەر ڕیڕەوی خۆی:

**Block**

وەك خانەی ناو خشتە:

**table-cell**

پێشان نادرێت:

**None**

که بێگومان چەندین شێوەی دیکەی پیشاندان هەیە، ئەوەی سەرەوە تەنها بۆ تێگەیشتن و بەکارهێنانەوە بوو، وە ئەوانە زۆر بەکاردەهێنرێت لەناو پێگەکاندا...
با نموونەیەك وەربگرین:

```
p{
display: table-cell;
}
```

لەم نموونەیەدا، بەشیوەی خانەی ناو خشتە، هەرچی نووسراوێك هەبوو نیشان دەدات:

ئەنجامی نموونەکە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| H4kurd {display} Property Example | H4kurd {display} Property Example | H4kurd {display} Property Example | H4kurd {display} Property Example |

**float**

واتە ڕاگواستن، بەشێك یاخود چەندبەشێك پێکەوە ڕادەگوازێتەوە بۆ لایەکی پەڕەکە، ئەمەش زۆر سوودی هەیە بۆ دارێژەرانی ماڵپەڕ، چونکە جاری واهەیە، تۆ سایتەکەت لەچەند بەشێك پێك دێت، یاخود دەتانەوێ هەموو بابەتەکان لەماڵپەڕەکەتدا بکەونە لایەکی پەڕگەکە، ئەوکات دەبێت تایبەتمەندی ڕاگواستن **float** بەکاربهێنی لە **css**.
لەبنەڕەتدا ڕاگواستن ئەم تایبەتمەندیانەی هەیە:

**left**
**right**
**initial**
**none**

وە بۆ نموونە بەم چەشنە بەشێك یاخود چەند بەشێك دەخەینە لای چەپی پەڕگەکە:

```
float: left;
```

لێرەش دەتوانی تاقی بکەیتەوە:
**http://www.w3schools.com/cssref/playit.asp?filename=playcss_float&preval=right**

بەڵام گەر بمانەوێت ئەو (بەش – چەندین بەش – هەموو) بخەینە ناوەڕاستەوە، دەبێت تایبەتمەندی **margin** بەکاربهێنین، لەدوایدا باسی دەکەین.

**font**

بەتەنها فۆنت جۆری نووسین و قەبارە دیاری دەکات بەهۆی نرخەکانیەوە، بۆ نموونە:

```
font: 12pt arial;
```

واتە **12** پۆینت قەبارەکەی بێت و پاشان جۆری ئەریاڵ بێت.

## font_family

جۆری نووسین دیاری دەکات یاخود خێزانی فۆنت، بەپێی ئەو تایبەتمەندیانەی خۆمان بۆی دەڕەخسێنین، بەو مەرجەی ئەو جۆرە فۆنتەی ئێمە دیاری دەکەین لەسەر کۆمپیوتەری بەرامبەر (ئەو کەسەی ماڵپەڕەکە دەکاتەوە) هەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو فۆنتەی ئێمە دیاریمان کردووە ئەو مەرجەی تێدا نەبوو، ئەوکات دەتوانین (هەمەچەشنەی جۆری فۆنت) دیاری بکەین، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکەم یاخود فۆنتی سەرەکی تێدا نەبوو، ئەوکات بێتە سەر جۆری دووەم و بەهەمان شێوە ئەگەر جۆری دووەمیش نەبوو بێتە سەر سێهەم وە هەتا دوایی.

تەنها جۆرێك:

**font_family: arial;**

چەند جۆرێك:

**font_family: tahoma, arial, verdana;**

جۆرێك دەکەیت بە سەرەکی:

**font_family: “tahoma”, arial, verdana;**

## font_size

قەبارەی فۆنت یاخود نووسین بە تیکڕا نرخەکەی بەیەکەی جودا دەپێورێت وەك (پۆینت، پانی، ئیلیمێنت، پێکسڵ،..هتد)، بۆ نموونە:

**Point:**

**font_size: 12pt;**

**Element:**

**font_size: 4em;**

**Pixel:**

**font_size: 20px;**

**Percent_width:**

**font_size: 200٪;**

## font_style & font_weight

شێواز و کێش قورسایی فۆنتەکان چۆن و بەچ شێوەیەك دەربکەون، بۆ وێنە (لار **italic**، زۆر قەڵەو).

**font_style: normal;**

**font_style: italic;**

**font_weight: bold;**

**font_weight: 900;**

تێکڕای نموونەیەك:

```
<html>
<head>
<style type="text/css">
#main{
font_family: "tahoma", arial, verdana;
font_size: 100٪;
}
#main .sa{
font_style: normal;
}
#main .sb{
```

```
font_style: italic;
}
#main .wa{
font_weight: bold;
}
#main .wb{
font_weight: 900;
}
</style>
</head>
<body>
<div id="main">
<p class="sa" align="center">H4kurd {font_style_normal} Property Example</p>
<p class="sb" align="center">H4kurd {font_style_italic} Property Example</p>
<p class="wa" align="center">H4kurd {font_style_bold} Property Example</p>
<p class="wb" align="center">H4kurd {font_style_900} Property Example</p>
</div>
</body>
</html>
```

ئەنجامی نموونەكە:

H4kurd {font-style-normal} Property Example

*H4kurd {font-style-italic} Property Example*

**H4kurd {font-style-bold} Property Example**

**H4kurd {font-style-900} Property Example**

### height & width

بەرزی و پانی بەشێك دیاری دەكات كە تاچەندێك دوور بێت لە بەشێكی دیكەی ماڵپەڕەكە، یاخود بەرزی و پانی بۆ وێنەكان، بەهەمان شێوە ئەمیش نرخەكەی بە قەبارە دەپێورێت و دیاری دەكرێت، بۆ نموونە:

```
height: 150px;
width: 200px;
```

### margin

سنوور، لێوار، كاری لە **css**دا ئەوەیە كە بەهۆی پێدانی یەكەكانەوە دوور دەكەوێت لەو (شوێن –ئاراستە)یەی بۆی دیاری دەكەیت، بۆ وێنە چەندێك لە بەشی سەرەوە **top** دوور بكەوێتەوە؟ ، یاخود چەندێك بەهەموو لایەكانی خۆیدا دوور بكەوێتەوە؟..هتد

**Margin** بۆخۆی دەتوانین بەهەموو ئاراستەكانی بناسێنین، بۆ نموونە:

```
margin: 2cm 8cm 3cm 6cm;
```

ئەوەش ئەم واتایە دەگەیەنێت:

(بەشی سەرەوە **2** سانتیمەترە، بەشی لای ڕاست **8** سانتی مەترە، بەشی خوارەوە **3** سانتیمەترە، بەشی لای چەپ **6**سانتیمەترە)

بۆ نموونە ئێمە بە تاگی **div** سنووربەندی دەکەین بەو چەشنەی نموونەکە:
ئەمەش تێکرای نموونەکەیە:

```
<html>
<head>
<style type="text/css">
body{
background-color: orange;
}
#main{
background-color: lightblue;
margin: 2cm 8cm 3cm 6cm;
}
</style>
</head>
<body>
<div id="main">
<p align="center">H4kurd {margin} Property Example</p>
</div>
</body>
</html>
```

ئەنجامی نموونەکە، شیکردنەوەی:




وە دەتوانین بەتێکڕا ئاڕاستەکان دیاری بکەین، واتە پێکەوە سەرەوە و خوارەوە و ڕاست و چەپ، بکەینە یەك نرخ:

```
margin: 200px;
```

نموونەیەکی دیکە ئەوەیە کە (**content**) واتە تەواوی سایتەکە – ماڵپەڕەکە، بخەینە ناوەڕاستەوە، ئەویش بە هۆی تایبەتمەندی **margin** لەگەڵ **width**ەوە دەبێتن، بەم شێوەیە:

```
margin: 0px auto;
width: 90%;
```

پاشان دەتوانین تایبەتمەندی **margin** لەگەڵ تەنها لایەك یاخود چەند لایەك پێکەوە دیاری بکەین، بۆ نموونە:

```
margin-bottom
margin-left
margin-right
margin-top
```

**margin_left: 10px;**
**margin_right: 10px;**

**opacity**

ڕاددەی ڕوونگۆیی، ڕوونی، بۆ شتێك دیاری دەكات، واتە تا چەندە كاڵ و تۆخ بێت، بە ژمارە نرخەكەی دیاری دەكەین:

**opacity: 0.7;**

```
#main{
background_color: lightblue;
opacity: 0.7;
}
```

ئەنجامی نموونەكە:




تێبینی/ **#main** ، ئایدی **ID** ناسێنەری تاگی **div**ە كە لەناو **html**دا دیاریمان كردووە بۆی بە **id="main"**، دەتوانن لە نموونەكاندا سەیری بكەنەوە.

**Padding**

بەهەمان شێوەی **margin** كە ئەمیش دووری لێوارەكان دیاری دەكات، بەڵام دەبێت ڕەچاوی ئەوە بكەین لە **padding**دا لێوارەكان لە ئایتم واتە شتەكەوە دوور دەكەوێتەوە وەك (فەرش) بەچواردەوریدا یاخود بەلایەك و چەند لایەكیدا دەچێنێت، **padding** ئاڕاستەكان بەهۆی ئێلیمێنتەكەوە دوور دەخاتەوە، واتە قەبارەی ئێلیمێنتەكە زیاد و كەم دەكات، بەڵام **margin** بەهۆی قەبارەوە دوور دەكەوێتەوە لە ئێلیمێنتێكی دیكە، بۆ نموونە:

```
p{
padding: 20px 10px 20px 10px;
}
```

ئەنجامی نموونەكە:




هەروەك **margin** بەهەمان شێوە دەتوانین قەبارە بۆ لایەك چەندلایەك هەموو لایەك بەیەكەوە دابنێین:

**padding_bottom**
**padding_left**
**padding_right**
**padding_top**

padding: 100px;
padding_left: 10px;
padding_right: 10px;

## text

تایبەتمەندی نووسین، دەق، لێرەدا **css** چەندین تایبەتمەندی بۆ جوانکاری نووسین داناوە، کە گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:

## text_align

ئاراستەی نووسینەکە دیاری دەکات (ناوەڕاست، چەپ، ڕاست، پڕبەپڕ):

text_align: center;
text_align: left;
text_align:right;
text_align: justify;

## text_decoration

بەواتای دیکۆر دێت، واتە دیکۆری نووسینەکە چۆن و بەچ شێوەیەك دەربکەوێت لەڕووی (هێڵ-خەت)؟، بۆ ووێنە:

خەت لەسەرەوەی نووسنەکە بێت:
text_decoration: overline;

خەت لەناوەندی نووسینەکە بێت:
text_decoration: line_through;

خەت لەژێر نووسینەکە بێت:
text_decoration: underline;

خەتی نەبێت:
text_decoration: none;

## text_shadow

هەروەك **box_shadow** ، بەڵام ئەم تایبەتمەندیە بۆ خودی نووسین دەبێتن، واتە سێبەر دەدات بە نووسینەکان:
text_shadow: 5px 3px 8px gray;

(ئاسۆیی **5**، ستوونی **3**، شەوق **8**، ڕەنگ ڕەساسی)، ئەوەش تایبەتمەندی ئەو سێبەرە بوو کەلەنموونەکە بەکارمان هێنا، بۆ زانیاری زیاتر سەیری **box_shadow** بکە.

## text_transform

گۆڕینی شێوازی دەرکەوتنی نووسیەنەکان، لێرەدا دەتوانین بە (سمۆڵ-کاپیتاڵ..هتد) بنووسین، بۆ نموونە:

بەشێوازی سمۆڵ:
text_transform: lowercase;

بەشیوازی کاپیتاڵ:
text_transform: uppercase;

بەشێوازی پیتی یەکەم لە وشەکاندا کاپیتاڵ:
text_transform: capitalize;

ئەوجا با نموونەبەك بەگشتی لەسەر تایبەتمەندی **text** وەربگرین:

```
<html>
<head>
<style type="text/css">
```

```
p.a{text_align: center;}
p.b{text_decoration: overline;}
p a.c{text_decoration: none;}
p.d{text_shadow: 5px 3px 8px gray;}
p.e{text_transform: lowercase;}
</style>
</head>
<body>
<p class="a">H4kurd {text_align_center} Property Example</p>
<p class="b">H4kurd {text_decoration_overline} Property Example</p>
<p><a class="c" href="#">H4kurd {text_decoration_none} Property Example</a></p>
<p class="d">H4kurd {text_shadow} Property Example</p>
<p class="e">H4kurd {text_transform_lowercase} Property Example</p>
</body>
</html>
```

ئەنجامی نموونەکە:

H4kurd {text-align-center} Property Example

H4kurd {text-decoration-overline} Property Example

H4kurd {text-decoration-none} Property Example

H4kurd {text-shadow} Property Example

h4kurd {text-transform-lowercase} property example

نموونەیەکی گرنگە لەمە **text** و لە ووێنەکە سەیری ناو براکێتەکان **{}** بکەن تایبەتمەندیەکان بەدیار دەخات لەسەر نووسینەکان. پاشان ئەو نووسینە شینە ئەوە بەستەرە، بێگومان کاتێك تۆ لەناو **html** تاگی **<a>** دادەنێیت بۆخۆی بەشێوەیەکی خودکارانە هێڵێکی بەژێردا دەهێنێت، بەڵام وەك لەنموونەکەرا دیارە ئەو هێڵەمان بە **css** لابردووە.

**hover selector**

کاتێك دەچینە سەر بەشێك بەهۆی **hover**ەوە دەتوانین تایبەتمەندی جودای پێ بدەین، ئەمەش بۆ بەستەرەکان باشن، واتە کە تۆ ماوسەکە دەبەیتە سەر بەستەرێك یاخود هەر شتێکی دیکە بێت، تایبەتمەندیەك یاخود چەند تایبەتمەندیەکی بگۆڕێت، بۆ وێنە ڕەنگی بانکگراوندەکە بگۆڕێت. **Hover** بەم شێوەیە دادەڕێژرێت:

```
Selector:hover{
Property: values;
}
```

نم:

```
a:hover{background_color: red;}
```

کاتێك ماوسەکە دەبەینە سەر تاگی **a** باکگراوندی ئەو نووسنەی کەکراوە بە بەستەر دەبێتە سوور.

وە هەروەها چەند سەلێکتەرێکی دیکە هەن بۆ بەستەرەکان:

بەستەری ئاسایی:

**a:link**

کاتێك کاری کرتەکردن کراوە:

**a:visited**

کاتێك ماوسەکە هەنوکە لەسەری لەباری پەنجەپێداندا بێت:

**a:active**

لێرە نموونەکە وەربگرە: **http://www.w3schools.com/cssref/tryit.asp?filename=trycss_sel_link_more1**

کۆتایی تایبەتمەندیەکان

ئەوەندە بەسە کە ئێمە بتوانین لەرێگەیەوە ماڵپەڕێکی جوان و نایاب بەهۆی **css** و **html** درووست بکەین، بەڵام تایبەتمەندیەکانی **css** هەر ئەوەندە نیە کە ئێمە ئاماژەمان پێکرد، بەڵکو گەلێك زیاترن، ئەوەی کە باسکران، تەنها ئەوانە بوون کە رۆژانە ئەوانەی لە بواری دارشتنی وێب کاردەکەن یان ئەوانەی حەز بەو بوارە دەکەن خۆیان لێی فێربکەن و چاویان لەزمانەکەدا بکرێتەوە، تۆ دەتوانی لەرێگەی ئەو پێگانەی خوارەوە زیاتر تایبەتمەندی ببینیت، ئەگەر پێویستت بوو:

**http://www.w3schools.com/css/default.asp**

**http://www.blooberry.com/indexdot/css/propindex/all.htm**

**http://www.quackit.com/css/properties**

لەسەر ئەم نموونەیە راهێنان بکە – پاشان سۆرس کۆدەکەی لە وەڵامدا بنووسەرەوە:




**SfD**

**http://h4kurd.com/h4kurd/user_113858.html**

**https://www.facebook.com/profile.php?id=100008461752993**